پەخشانە شیعر

# کەرنەڤاڵی عەشقی ناو بەفر

خالید مەجید فەتحوڵڵا

٢٠١٣



کەرنەڤاڵی عەشقی ناو بەفر .................... خالید مەجید فەتحوڵڵا

ناوی کتێب: کەرنەڤاڵی عەشقی ناو بەفر

بابەت: پەخشانە شیعر

ناوی شاعیر: خالید مەجید فەتحوڵڵا

دەرهێنانی هونەری: دلێر رەفیق

لە بڵاوکراوەکانی یەکێتیی نووسەرانی کورد– لقی کەرکووک ژمارە (٢٢٥)

چاپخانە: کارۆ

چاپـــی یەکـــــەم: ٢٠١٣

تیراژ: (٥٠٠) دانە

**پێشکەشە بە:**

**تۆ...**

**بە هەردوو کچەکەم**

**ئایڤەر و نەورۆز**

# لەگەڵمابە...





لەگەڵمابە تا ئەوسەری دنیا
دڵی خۆت پڕکە لە خەونی شیرین
لەگەڵما بچۆرە ئەو سێبەرە ڕەنگاوڕەنگەی
جێژوانی خۆمان لێیسازکرد...

× × ×

لەگەڵمابە وەک گەورەکچێکی چاوکاڵ
پێویستیم بە تۆیە
تۆیەک لە شەوی تەنیاییمدا میوانم بێ
لە قووڵترین جێگەی خەیاڵ
لە تەکمەوە دانیشێ...

× × ×





لەگەڵمابە وەک عەترێکی ناسک
ئەمێستاش لێوم بۆنی ئەو شەوانەی پێوەیە
بۆ سەر گۆنای نەرمی تۆ..
چاوەڕێی سبەینێ دەکات...

× × ×

لەگەڵمابە وەک ڕێچکەی بنارەکان

ختوکەمدە وەک دەم و لێوی ئاگر!

مەستمکە بە نەشئەی چاوەکانت

تا ترپەی دڵم بەدەمتەوە پێبکەنێ...

× × ×





لەگەڵمابە وەک تەنیایی خۆم

وەک حەسرەت و خەم

دەست بنێ سەر دڵم

لەگەڵمابە وەک هەناسە

وەک پێکەنینی ساوایەک

دڵنیایی بداتە ئەو دایکەی..

کە دڵی پڕە لە گریانی من...

× × ×

لەگەڵمابە وەک چریکەی شیعرێک

لەبەر پەنجەرەیەکی فێنک

لەگەڵمابە وەک ئێوارە ناسکەکان قەدپاڵی شاخ

لەگەڵما هاوار لە عیشوەی (با) بکە..

بۆ ڕۆژگارێک.. ناتوانین بیر بکەینەوە.

**کەرکووک ٢٠١٣**





**چاوەڕوان بووم تەنیاییم لێ دەرکەیت!**

وەک دێوانە هاتووم بۆ سەر ڕێگەت

هەموو ڕۆژێ لەو شوێنەی کە تۆ دەبینم

هەستەکەم هێشتا..

خەمەکانی نێوان دووری و

شەوی بێ وچانی من بەردەوامن!

× × ×



کەرنەڤالی عەشقی ناو بەفر ............... خالید مەجید فەتحوڵڵا

وەک دێوانە هاتووم بۆ سەر ڕێگەت

بەرەو شوێنێک دەتبەم

دوای هەر هەناسەیەک

خۆزگەیەک هەڵمئەسێنێ

جگە لە خەیاڵی دانەمرکاوی شەوانەت

هیچی تر نابینم!

× × ×

وەک دێوانە هاتووم بۆ سەر ڕێگەت
لە ڕۆژانی سەرمادا
ناهێڵم کەسێک پێم بڵێت:
بۆ بە تەنیایت!

× × ×





وەک دێوانە سەر ڕێگەکان دەگرم
وەک (با) بۆت دەگەڕێم
هەر ئەوەندەی بەدیارمەوە دەوەستێیت
دنیام لێدیارە!
وەک دێوانە بەرەو شوێنێک دەتبەم
هەر تۆی لێ بێت
تۆ من بدە کەنار
خۆشەویستییەک نیشانەمکات
کە دەزانێت چەند خۆشم دەوێیت!

× × ×

وەک دێوانە بەرەو شوێنێک دەتبەم

لە خۆم جیا نەبیتەوە

دڵی من بە هەموو تەلیسمی خۆیەوە

هێشتا نازانێت..

چۆن شەپۆلی تۆ تێبگەیەنێت!

× × ×





کە تۆ بوویت بە گەرمترین شەوانی من

گشت خەیاڵەکانم تۆڕدا

لە پاڵ پەنجەرەکانەوە چاوەڕوان بووم

تەنیاییم لێ دەرکەیت!

**کەرکووک ٢٠١٣**

# کورتە هەواڵ!؟





(١) پیرەوەری

لە ڕاڕەوی ئەم هەورازەدا

هەواڵبەرێک بە ملەکەدا

هەڵگڕا تا ئاودیو بوو

بۆ سبەی خەونێکی سەوز

چووە پاڵ ڕێبوارێک

پیرەوەرییەکی پێدەگوتەوە!

(٢) تەنهایی

لە تەنهاییمدا
ژان نەما لە خۆمی نەدەم
تۆش لە پڕیاسکەی خەیاڵی بەختتدا
پەپوولەیەک بووی
گوڵ نەما بۆنی نەکەی
نە من بەژان مردم
نە تۆش بۆ گوڵیم
تەنها جارێک
بەرۆکت گرتم

× × ×





(٣) ڕێ

کە هاتییە ڕێم.. وریابە
ئێشێکی بڵندم تیایە
وریابە..
ژامێکی دێرینم پێیە
نەکەی لێی هەڵکەوی!

## (٤) ئامێز

چاک دەزانم لە دەربەندی حەزەکانا

بێ من داناساکێیت

هۆ عاشقە کۆچەرەکەی ناو ڕۆحی من

منی عاشق نەبم..

کێ ئامێزی ناو دڵی خۆی

دەکات بە لانەی کچە ڕەبەنێکی

وەک تۆ!





**ئەو شەوەی خەونت پێوە نەبینم!**

کە شەو دێت..

من دەبمە فەرشی جێگەت

ئەو چاوانەی چاوەڕوانی تۆ دەکەن

ناخەون!

ئەو لێوانەی تامەزرۆن بۆ هەندێ ماچ

زەوتیانکە!





بەبێ تۆ، ئەمشەو، وێرانە دڵم.

ئەو دڵەی، بەبێ تۆ، ئارامناگرێت.

ناخەوێت!

ئەو شەوەی کە خەونت پێوە نەبینم

هەستەکەم تۆ لەگەڵما نیت.

ناخەوم!

**کەرکووک ٢٠١٣**

## ئەم بەیانییە!





ئەم بەیانییە، هاتمەوە خۆم

لە خورپەیەکی کتوپڕا... تێگەیشتم

ئەم هەنگاوەم زۆر کورتە

هەموو ژیانم..

بەشی چاوەڕوانییەک ناکات

چاوەڕوانییەک

پێیدەم بەدەم چاوەڕوانییەکی ترەوە!

× × ×

ئەم بەیانییە.. بەر لەوەی پێم

زۆرتر لەوەی تۆ.. پیری لێ دەکەیتەوە

پیرم کەوتەوە...

وێنەیەک بۆ لەش و لارت بکێشم!

× × ×

**کەرکووک ٢٠١٣**





# چاوەکانی تۆ!

چ جوانە کە تۆ پێدەکەنیت
بەرەو هەر شوێنێک دەچیت
لەناو دڵما
سەیری خۆت بکە
تا ژانی دڵم دیلکەییت!

× × ×





هەناسەی تۆ،
ژیانم پێدەبەخشێت
تا هەبم
دەزانم بەبێ تۆ عاشق نیم
چاوەکانی تۆ وایانکرد
شەوی من..
پڕ بێت لە خەیاڵ
خۆشەویستی پێ بگات
شیعر ڕاپەڕێت!

× × ×

**لەوێ...**





لەوێ...

گوێت بۆ نەغمەیەک هەڵخست

سەختتر لە فڕینی شاعیران و

گەرمتر لە گریان و پەشیمانی

لەوێ...

لەشت بلآچەی داو

لە هەموو ئێستاکانی غەریبیتدا

ناڕەحەت بووی...

لەگەڵ خوداو... لەگەڵ شێتی خۆت

هەموو جارانی جارانت

بۆ نادۆزرێتەوە...





لەوێ...

لە بەردەم ڕابردووی خۆت،

سەرت لە مێژووی تاڵی سەفەر

دەرنەهێنا...

بازت بەسەر شەوە درێژەکانی منداو

سیحرت لە فرمێسکی چاوەکانم کرد

پەلکە زێڕینەت لەسەر برینەکانم دانا

ئێستا..

لە تەنیشت چنگی خەونی خنکاوی خۆمەوە

نووزەی زامی تۆ... هێور دەکەمەوە

× × ×





**هەڵەبجە!!**

بەیانی بوو... هێشتا هەڵەبجە

بەشێک بوو لە جوانی بەهار

وەک پەپوولە،

لە دوورەوە پێدەکەنی و..

بۆنی گوڵ لە هەناسەیەوە دەهات.

× × ×



کەرنەڤالی عەشقی ناو بەفر ..................... خالید مەجید فەتحوللا

بەیانی بوو... هێشتا هەڵەبجە

وەک منداڵێکی چاوکاڵ

لەژێر تیشکی هەتاو

عەودالی یاریکردن بوو

× × ×

بەیانی بوو... هێشتا هەڵەبجە

لە خەرمانی دوای عەشق

بەشی خۆی لە شەفەق هەڵنەچنیبوو

هێشتا ژیان بەسەر پەنجەرەکانییەوە

خۆی دەپشکنی



کەرنەڤالی عەشقی ناو بەفر .................... خالید مەجید فەتحوڵڵا

باڵندەکان

لەسەر لێوی درەختێکی ئاودار

بە هەموو عیشوەی خۆیانەوە

سەیری ئاسمانیان دەکرد؛

ئەی خودا.. کوشتنی ئێمەت لەچی!

**کەرکووک ٢٠١٣**

## چوارچێوەی..
## هەواڵێکی پێش مەرگ!





سەرنجم نادرە هەوراز و چاوم لە ترۆپکی چیا بڕی
پشتم کردە پێدەشتێکی بەرین و،
مەقانێکی پشت کورم هەڵبڕی!
ئەوە بەری چەندین ساڵمە
پرچی شیعر دەهۆنمەوە
لە زنەی کانیاوی مێشکمدا
ئاونگەکەی کەزی عیشقی (حەبیبە) دەخۆمەوە

× × ×

سینگم نابووە تیرو، ڕۆحم

لە پای تۆدا بە (با) دەکرد

ئەمێستا چەمی خوڕەی بەئاوم.. لە گەردا

دەشۆمەوە!

× × ×





وەک تابلۆیەک.. چاوەکانم..

بە دڵۆپی برسێتییان دەرکەوتووە!

چیم لە تارای بەرەبەیانە... کازێوەکەیم لەدەست

چووە!

× × ×

چەندین ساڵە ئەم مێشکەی من
کە وێردی عیشقی ژیانە..
تەنیا ڕێڕەوی ئەم چەمی
بەخوڕەی گرتۆتە بەرو،
هەردەم بەتاڵە!

× × ×





نە بۆن دەکەم بەقەدەر تۆ
نەیش دڵم.. چەشەی زمانی عیشقت
دەداتە کۆڵ!
بەهەر هەورازێ گوزەر دەکەم
ساباتی هەواری من خاڵییە!
هەر گوڵێ لە خۆم دەدەم..
لەخۆم سیستر دەبێ!

× × ×

لە ئاسمان جارێ پێکەنی بۆم

لە تاوێ بەدلی خۆم.. هەڵپەڕیم

هەر ژان و،

ژان و،

ژان!





قوتابخانەم ژان و،

ماڵم ژان و،

حاڵم ژان!

کە گەییمە بەر..

بوومە کۆتەرەی ئاگردان..

ئەمێستاش. چاوی من لێڵە

یان چاوان کوێراییان داهاتووە؟

کە خوێنی من لە دوا تنۆکدا.. تکا
ئێستاش نشینگەم نەبێ..
پەل بوو بەدار!
بەرد بە شاخ!
ئاو بە ڕووبار!
گوڵ بە بەهار!





تەنیا دەستی منیان بڕییەوە،
سکی برسییان هەڵدڕی.
مەڵۆتکە شیعرێکی گریاویان نایە بەردەم،
قوتابخانەکەی (نالی) و (مەولەوی)
هەر ئەو سەردەمە..
بوو بە سەنگەری عاشقان و،

دەستێک بەرەو بەرزی

دووان بەرەو زەوی

دەنگیان بۆ سروودی؛

دارو،

بەردو،

ئاو!

هەڵبڕی...

**کەرکووک ١٩٩٩**

**لە ژمارە (٣١٨٣)ی بەرواری ١٩٩٩/١٠/١٣ لە ڕۆژنامەی (هاوکاری) بڵاوکرایەوە.**





# کە جێم دێڵی...

کە جێم دێڵی...

باڵدارێکم..

بێ لانەو بێ گوڵ...

لە ئاسمانی پێزاریدا

وێڵم بێ چڵ...

× × ×





کە جێم دێڵی...

کەشتێکم..

کەنارەکان پێ نازانم

هەر گریان و هەر فرمێسک

دەبێتە فەرهەنگی ژیانم...

× × ×

کە جێم دێڵی...

سەرگەردانم..

تەنیا ئەژیم لە دڵتەنگی

تەنیایە ئاو،

تەنیایە نانم.

گەر هەڵوەریێ گەڵای ژیانم

لە ڕێگەتا

بێ تابووتیش هەر شانازم

چونکە کوردێکی دڵپاکم...

**کەرکووک ١٩٧٩**





## دڵم بە عەشقی ئێوە.. لێدەدات

فێر نەبووم، دەفتەرەکانی بیرەوەریی ونبکەم.!

ئاهەکانم هەڵگرە، چونکە من پشکۆکانت دەبەم.

ڕێگە بەم قاچاخچییانە مەدە..

دڕکەکانیان، لە سینەمدا کۆ بکەنەوە!!

× × × ×





ئاخ! لەو سەردەمە سەیرانەی،

وەک باڵدارێکی ئارام..

لەژێر زەبری قەدەر، گوڵێک نەبوو..

ماچی بەیانیم پێ ببەخشێت!

لە برین، زامی خۆم چنی...

ئەوەی شوێن قەتماغەی من بوو

لە نێوان دوو درەختدا،

خەون دەبیات و.. خەون دەبیات!!

× × ×

بڕۆ..

ئەی ئەوەی بەگومان بووی لە چیمەنی بەهار!

لە سووتانی شەونمێک دا..

لە مژدەی چاوەڕوانیەکی چاوکراوەدا

بڕۆ..



کەرنەڤالی عەشقی ناو بەفر .................... خالید مەجید فەتحوللا

ئەی ئەوەی بڕینی خۆی،

بەمێژووی عەشق.. ناناسێتەوە!

بڕۆ.. بڕۆ..

من، درەنگ زانیم

ڕێگەمان، هێندە نییە..

سەفەرمان بگاتە جێ!!

× × ×

بەر لەوەی بڕۆم.. لەبری تۆ

خۆم تێکەڵ بە خوێن و زام، دەکەم.

خۆت، پڕکە لە بۆنی خاک و.. پەلە بکە

تامی خۆر..

تەنیا لەژێر یەقیندا





نغرۆ دەبێت!!

ئەگەر دلی من، ڕووناکی هەبایە

ڕۆژی تۆ..

پڕ دەبوو لە ئاوەدانیی!!

× × ×

سەفەرێکم

لە پێش هەنگاوەوە، دەڕۆم!

لە یەک پرسیاردا،

هەموو وەڵامەکانم بردەوە...

من، دەمویست

بەنامە خوێناوییەکانی ناو دڵم

لە یاخیبوونەوە، بچمە ئەوبەرو..



کەرنەڤالی عەشقی ناو بەفر .................... خالید مەجید فەتحوڵڵا

لە سووتمانی گوڵەکان دا،

پشتاوپشت..

بگەڕێمەوە سەر لاشەی

بەجێماوی پەپوولەکان...

× × ×

کە من دڵم خۆی پڕ بێت

لە چاوەڕوانییەکی ژاکاو،

پڕ لە هەناسەیەکی بابردوو،

پڕ لە چارەنووسێکی نادیار،

بەجۆرێک، سەفەر تەنیا خۆی..

ئاوڕی لەو هەنگاوانە، دەدایەوە..

کە لە راچڵەکانی خۆی.. سەیرترا!





من و تۆ، گیانمان..

لەژێر سایەی درەختێکدا، بیینی

بیرکردنەوەمان، گوفتێک بوو..

لە نێوان نهێنی دوو کەناردا،

بچینەوە پاڵ یەک!!

× × ×

وەرە.. زامەکانت فڕێدە..

دەشێت لەلای ڕێبوارێکی ڕدێن سپی دا

بەیەک بگەین!

من و بڕین..

لە خەونێکی بەجێماوی تۆدا

ناوی خۆمان، نووسی...





ئێوارە بوو..

دوای ئاوابوونی خۆر..

کە دەروازەکانی شاریان، داخست

من بووم،

یادەوەریی خۆم لە قەراغ جادەکەدا..

بەجێهێشت...!!

× × ×

تۆ تامی گومانێکت، لێدێت

لە سۆراغی پرسیارێکی نەزۆکدا

لە نائومێدی زیاتر.. شک نابەی!

کەس، لەسەر دەستی دۆڕاوێک

بەدیار خەیاڵێکەوە، نانوێت

دوای ئەم هەموو ڕێگەیە..

ئیدی سوارمان بۆچییە..

× × ×





وەک پەپوولەیەکی پێگوناە..

نهێنی خۆم لەگەڵ سۆزی تۆدا

بەشکرد...

ئازادیم، تا سەر ئێسقان

لە نەشئەی بڵێسەیەکدا، خوێندەوە

(دەشێت بۆنی شکۆفەی خنکاوی ناو دیدەم

بکەیت)*

× × ×

* تاکە دێڕێکی شاعیر (بەختیار عەلی)یە.

کەرکووک/ ٢٠٠٧

# تا سێبەرەکان.. بۆگەن نەکات!





(١)

من لە دەرگای دڵی تۆم دا.

خەیاڵی خۆم..

بەسەر ئەو ساتانە،

جێدەهێڵم...

لەوپەڕی عەشقەوە،

کە فڕێیاندامە خەوێکی گەورەوە...!

× × ×

(٢)

ئێرە..

پڕە لە بۆنی گوڵ.

ئێمە.. هێشتا،

سەیری ئاسمان دەکەین..

تا سێبەرەکانمان

بۆگەن نەکات...!

× × ×





(٣)

هیچم نەدی!

من ڕۆحی خۆم..

بە تۆوە بەستبوو

ڕۆژگارێک بوو..

شیعرەکان.. پێیان لە جێژوان،

دەهاتەوە...!

× × ×

(٤)

بۆ ناڕوانیتە شوێنەواری برینەکانم

بۆ؟

دەڕۆم و چاوەڕێم

ئارەزووەکان بەسەر چل و چێوی مندا

بکشێنەوە...

لە مێژە حەز دەکەم.. ماچیان بکەم...!

× × ×





(٥)

زۆر لەمێژە

دڵە گەورەکەی لەوتاوە...

(من) لۆمەی تۆ ناکەم.

(ئەو!).. لە چاوی کەسێکەوە

خەمی ژیان ڕادەگرێت..

گۆمان لە چاوەڕوانی پاشەڕۆژ دەکات...!

× × ×

**کەرکووک ٢٠٠٧**

## ئەم عەشقە کوا بەرگەی خەم دەگرێت؟





١

ئەگەر دەنگی تۆ، لە دەنگی کەو، خۆشتر نەبێت
ئیدی نە چیام خۆشدەوێت نە بەهار...
من ڕقم لە پایزە شیعرەکانە،
کە سێبەری منیان لە سێبەری تۆ جیا کردەوە...
من نهێنی خۆم بەخشییە دوورترین ئومێد

سەیرکە،

چەند سەختە تەڤر و تونا بوونی ماڵی عەشق

ئەوەتا، دڵم لە چاوەڕوانی دەلەرزێت

ئەوەی کە قەدەر ناوی دەبات،

من و تۆ.. دەپچڕێین!

× × ×





٢

پێزاری تۆ لە سینەمدا..

بۆنی خەونێکی لێدەهات.. بەخوڕ دەباری!

هەر برینێکی لەشمان،

ڕەنگی سەفەرێکی گرتبوو...

ئێستا،

نە لە گریان دەگەیت.. نە لە بەختیاری!

× × ×

٣

من ڕێبوارێکی ئەڤینم لە نێوان هەردوو چاوەکانت

من و تۆ،

لەیەک نیگادا.. کۆ دەبینەوە...

لەوێ، لەوپەڕی دونیا

بەسەر یەک دڵ و گیان، دابەش دەبین.

ئیدی، بۆ ئەم سەفەرە پڕ دەکەیت لە خەم

ئەم عیشقە کوا بەرگەی خەم دەگرێت؟

× × ×





٤

لە پاڵ پیرە درەختێکی ئەم شارەدا.. وەستام

بەناو هەزارەها خەونی ڕەنگاوڕەنگ.. تێپەڕیم

لەناو نهێنی خۆمدا..

بەسەرسامیی دڵم پڕ بوو لە گریان..

گوێم نەدایە باڵەفڕکێی هیچ پەپوولەیەک و

لە چاوبڕکێی هیچ گوڵێکیش.. ڕانەمام

وەک هەر یاخییەکی جەرگ بڕاو،

دیسان ڕوومکردەوە عەشق..

ڕوومکردەوە نەشئەی ئەو بریناەنی

بەتام و چێژیان..

هەناوی شیعرم.. هاتە زمان!

**کەرکووک/٢٠٠٩**





## چوار چیۆەی چەند هەواڵێکی دڵتەزێن!!

١

## هەڵەبجە

ئارۆم.. تا پیر دەبم و..

تۆیش لەگەڵ من گەورە دەبی!

کە دێمەوە. قەڵایەکی ئێرگزیت بۆ دەکەم.

منیش پڕم وەک پێدەشتی پڕ پشکۆی تۆ.

بۆ کڵافەی هەر مەینەتییەک. ئاتوێمەوە!





ئەمڕۆ، ساتێک نییە هێندەی ژانی من،

گرژ و ڕەق ئەستوورتر!!

هانێ دڵم. تەماشای خۆت بکە. ئەی هەڵەبجە.

دەزانم برین لەکوێوە دێت.

فرمێسکەکان چ چاوێک گڕ دەدەن.

کام بەهار

کام نەورۆز

بەدیار تەرمی پەپوولەکانەوە دەنوێت!!

× × ×

ئەمجارە یان ئەگەر هاتیەوە سەر خوانی زیندەگی.

وەک زەردەخەنەی تەنیایی پڕبووبێت لە کڵپە و گڕ.

ئەوە منم لە بەردەم گەورەیی تۆ.

لە بەرزیی ئاسمانەوە. سەرنج دێنم. گەرم و گوڕ.

لە تڕیک سێدارەی درەختێکەوە هاوار دەکەم ئەی

هەڵەبجە.





من لە غەیری لاشەی بێ گوناه،

لە مانای هیچ برینێک ناگەم.

نهێنی شیعرێکی تازەم بدەرێ.

شیعرێک. جەستەم پڕکات، لە وشەی تەڕ!

× × ×

ئێرە. پێدەشتێک نییە لە کاڵبوونەوەی

پیرەوەرییەک.

لەبەر بەرۆکی هەر کانی و لەبەر پەنجەرەی هەر

بەیانییەک.

بۆ ژوانێکی سپی. یەک دەگرین!

کە هاتییە لام:

وەک پەلکەزێڕینەی ڕۆژانی شۆڕش و ڕاپەڕین.





کە هاتیە لام:

پڕ بیت لە هەناسەی زیندوو.

نەگری بۆ بەختی خۆت.

من لە کەژاوەی گەردنی خەیاڵدا.

ئاخێک. پاوان دەکەم.

نهێنی جوانییەکان گرێ بدات. ئەی هەڵەبجە.

× × ×

٢

**[بەش]**

لەسەر چڵە بەرزەکانی نهێنی مندا، سەما بکە.

بەسەر پشکۆکانی ئەوین. کە بۆنی واوەیلای

مەحاڵیان لێدێت. بفڕە.

لە مێژە، لە گیانی پەپوولەدا، نیشتووم.

لەسەر سۆزی حەقیقەتدا. بەشی خۆم.

لە ئارەزوویەکدا. هەلا هەلا کرد!

× × ×





٣

**[دڕک]**

تۆ هاتیت. لە سووتانی مندا. گوڵاوی پەیڤین

دەدۆزیتەوە.

گوڵاوێکی زۆر. کە لە تامی دوێنێ ناچێت!

شەو. دێت و، لە برینی بەجێماوی مندا.

بە وەهمێکی تر. جەستەم پڕ دەکات لە دڕکی

ڤیتنە و گومان!

× × ×

٤

**[مانگ]**

دوێنێ شەو. مانگم بە شەرمەزارییەوە دیت.

چۆن لەسەر پێخەفی سپەینێدا.

رۆژی بووکێنی خۆی بهێنێتەوە یاد!

× × ×





٥

**[زەمەن]**

هەنگاوەکان. چەشنی حەزێکی خێر لەخۆ نەدیو.

لەژێر سێبەری شەرمناویی شەقامێکی

خۆلەکەویی.

تەنیا و تەنیا تر. لە دامێنی باریکەرێی وەلآمێکی

نەزۆک

هێندەی پانتایی ولآتەکەم.

زەمەن. کل لە چاوانمان دەدزێت!

× × ×

کەرکووك ٢٠١١

## عەشق.. عەشقێکی گەورە!!





خەونەکانی ئێمە،

بەتاریکی زامدار دەبوون!

خەیاڵمان پێدەنگییەکی ژەهراوی بوون

پڕبوون لە حەسرەت و یادگاری

زەردەخەنە،

لای ئێمە هەیبەتی نەبوو

هەر برینێکی ئێمە

لەڕووی چاوەڕوانیدا..

بورجی خۆی هەبوو!

بەزەبری ڕەنگەکان..

ناویان لە خۆیان دەنا...

× × ×





ئەی هاوڕێ:

بەفرو،

شاخ و،

کەو و،

کانی..

لە خاکی ئێمەدا

عەشق بوون

عەشقێکی گەورە

بەئازار دەدرەوشانەوە...

× × ×

ئەی هاوڕێ:

ئێمە دەرگامان نەبوو

دەنگێکی تووڕە بووین

لە کیشوەرێکی پەککەوتەدا..

لە بری نان،

گەدای برسیمان..

لە وشەی تەڕ،





پڕ دەکرد و..

لەژێر زەبری زەمەندا

ڕەوا نەبوو،

بپەڕێنەوە ئەوبەر!

ئێمە بە چپەی ئاواتێکی گەرم

گەرمتر لە دەم و لێوی عاشقان

بووین بە عەشق

عەشقێکی گەورە...

ئێمە،

چاوانمان پڕبوون لە وێنەی ئادەمیزاد

دڵمان وێنەی وڵاتێک بوو..

خەوبوو..

لە کەژاوەیەکدا،

منداڵیی خۆمان بێنینەوە یاد!

× × ×



کەرنەڤالی عەشقی ناو بەفر .................... خالید مەجید فەتحوللا

خۆشەویستم

ئێمە،

هاوڕێی پشکۆکانی هەتاو بووین

برسێتی ئێمە،

پڕی بوو لە گوڵ و

ناو دەممان

بە سروودی خوێناوییەوە..

گەرم دەکردەوە!

لەسەر بەرد و

قەدپاڵی چیاو

جۆگەلەکاندا..

حەزی ئێمە

بەختی بەجێماوی خۆشەویستیان

ژیر دەکردەوە...

ئیدی نازانم،





برینی ئێمە تاوان بوو

یان ئێمە

وەک یادگار..

بەدووی ئازار دەکەوتین!

شەوی گەردەلوولی ئێمە،

پڕ بوون لە تریفەی مانگەشەو

سەفەر بەدوامانەوە..

چارەنووسی خۆی هەڵدەبژارد!

× × ×

ئەی هاوڕێ:

ئیدی ئێمە،

لە گوناهەکانمان..

ورد ئەبینەوە و،

لە ئارەزووی خۆماندا..

ئەبینەوە بە نهێنی!

جارێکی دی..





نابینەوە بە عاشقێکی سەرخۆش

ژوانێکی بێ تام،

وێڵمان بکات!!

ئێمە،

لەناو دارستانی خۆماندا..

تەنیا بۆ گوڵە نێرگز دەچەمینەوە

کە بۆنی هەنگوینی نەورۆزی لێ بێت
ئەوانەی لە ئاسمانی بەرینی ئێمەدا،
ویستیان ڕۆژ لە سێدارە بدەن!
ئیدی
زەوی دڵمان..
ئایانگرنە خۆیان...

× × ×

**کەرکووک ٢٠١١**





# پێم ناکری؟!

پێم ناکرێ بێ تۆ بژیم، دوور بم لە تۆ

بەس ئەم تیشکە.. هەڵوەرێنە

بە خولیای خۆت.. نیشانەمکە

بەچاو، بەدڵ

وەک حەزێکی دوور و درێژ

شەوی تەنهاییم بهەژێنە

× × ×





پێم ناکرێ، بێ تۆ بژیم، دوور بم لە تۆ

هەر تۆم دەوێ.

تۆیەک بە خەندەی جوان

بە نیگای ڕووت و گەش

بە هەستی منداڵیی... ژیرم کاتەوە

تۆم دەوێ... ئەمڕۆ، نەک سبەی

ئەوە دڵم... با قسەت بۆ بکات!

× × ×

پێم ناکرێ، بێ تۆ بژیم، بێ وەستانی تۆ

لە پاڵ کانییەکی بنار چاوەڕوان بم

هەر ئەوەندەت پێ دەڵێم:

لە هەر جێیەک بی،

وەک کۆرپەی ساوا... بۆ لات دێم.

× × ×





## ڕەش و سپی!

ببوورە گەر پێم وتی:
قژت تاڵ تاڵ سپی تێکەوت
ڕەش و سپی وەک وشک و تەڕ
لە کۆشی یەکدا... نوستوون
من و تۆ نەبێت وەک میوانێکی بەدبەخت
شەو و ڕۆژی خۆمان نەژمارد





لەگەڵ سەفەرێکدا.. بێ خەیاڵ بووین
مۆڵەتمان نەبوو بە عەشق بڵێین:
ئێمە چاوساغی تۆین
ئێمە پڕین لە تامی خۆشەویستی
تەمەنمان لە چاوەڕوانی هەڵخست و
دڵمان لە ژێر بارانی بەیانی
پڕکرد لە خەندەی یەکتر...

ئەی ئەو شۆخەی،

کە هەموو بەیانییەک دێمەوە لات

هالآوی ئەم پرووسکەیە.. نامتۆقێنێ

دێم و، بە زەردەخەنەی تۆوە مەستم

ئارەزوویەک لەسەر لێومە..

بەر لەوەی بڕۆم،

بەدیار چاوەکانتەوە دەوەستم

× × ×





## دوو دڵ نیم!

هەموو ڕۆژێ تۆ یەکجار دەبینم
یەک ڕێگەم هەیە بۆ دیتنی تۆ
تێیکم بە ئەی گوڵ...
دوو دڵ نیم بەڵێنت ێ بدەم
پێبکەنە وەک دێڕە هەڵبەست
تا ببینیت...
چ خولیایەک لە سینەمدا،
درێژترە لە هەناسەت!

× × ×





## ڕۆژ!

ئەی ڕۆژ... تۆ وەک من،
خوێن لە سینەتدا نەهاتە خوار...
کە هاتمە بەر دەرگەی ماڵی تۆ
بە ئارەزووی سەفەرێکەوە..
خەو لە دڵ خەبەرکاتەوە
تۆ لە وەختێکدا سەیرت کردم





هەموو شتێک لە برینی مندا،
بۆنی مەرگی لێ دەهات...
کە تۆ وەک زەردەخەنە،
منت خستە سەر لێوی خۆت
گوڵم گرتە دەست و.. گلەییم نەکرد!

× × ×

ئەی ڕۆژ... وەرە ماڵم

بە تۆزی سەفەرەکانی جارانتەوە

بە خەیاڵی ئەو ڕۆژانەی

پڕبوون لە پێکەنینی شیعر!

لە خۆتی مەشارەوە،

تۆ سەردەمێک لە لێوەکانما..

وشک بوویتەوە!

× × ×





ئەی ڕۆژ... لە نزیکەوە

بمپەڕێنەوە ئەوبەر...

من چاوم دادەنێم و

تۆ لە ناویا بفڕە...

من گۆناکانم هەڵدەخەم

تۆ بە خەندەی بولبول

وەرە پێش... من ڕاپێنە!

بە تکەی شەونم... بە بۆنی خاک

بەدیار پاسارییەکانەوە.. بوەستە!

× × ×

ئەی ڕۆژ... بانگمکە

پێکەوە بچینە سەر کەنارە دوورەکان

ئەمەیە دونیای ئازادی تۆ،

لەسەر فەرشی هەموو جوانییەک

کە تۆ بەڕێوەیت،

بەدیار دزەنیگای چاوەڕوانی خۆمەوە





پڕ دەبم لە ئاگر و با

وەرە دەستم بگرە،

تا لە پووچی ئەم زەمانە پێمە دەرێ و..

بمخەرە پێش خۆتەوە!

**کەرکووک/٢٠١٢**

**بڕۆ.. با هاوارەکانم شی نەبنەوە!**





بڕۆ...

بڕۆ...

ئەو گومانەم بۆ ساغ نابێتەوە

کە لە ڕوحما گەورە بوو

هەناسەم نەماوە،

هەناوی خۆم تێبگەیەنم!

× × ×

ڕێبواریم

لە ژێر دار بەڕوویەکی پیر

بە ئەستێرە ناساند

تۆیش بڕۆ..

وەرزێکی دیکە بکە دۆستی خۆت

عەشقی من،

نرکەیەکە لە نزیک ڕەزێکی سووتاودا

× × ×





بڕۆ...

بڕۆ...

من بۆ وەستانێکی گەورە

گەلێ تۆفانم بڕی

لەگەڵ هەموو جوانییەکدا

زەردەخەنە ماچ دەکەم و

لەپێش لێوەوە دەڕۆم

× × ×

بڕۆ...

بڕۆ...

هێندە تەنهایی خۆت

مەدە بە یەکدا

یادەوەری خۆت..

لەسەر تاوێرێک بنووسە

تامەزرۆ لە ئێوارە تاڵەکانی مندا

× × ×





بڕۆ...

بڕۆ...

تا ڕۆژیان لەبیر نەبردوومەتەوە

پێدەچێ من جارێکی تر پێ نەگرم

بەڵام ئەو تاریکییەم لادا

کە لەگەڵ منداڵیی مندا گەورە بوو

× × ×

بڕۆ...

بڕۆ...

من خەونی خۆم

خستە بەردەمی باڵندەکان..

لە پاڵ کەنارێکی سەوزدا

بەڵێ من تەنها لەوێدا

بیرم لە لەزەتی نهێنییەکان کردەوە

کە پڕن لە بەختیاری باخچەدا

× × ×





بڕۆ...

بڕۆ...

لە دامێنی درەختە بەرزەکاندا

خەریکی پشکنینی ژیان بە

تێ بگە..

ئەی ئەو ڕێبوارە تەنهایەی،

عومرت لەگەڵ مندا بردە سەر

× × ×

بڕۆ...

بڕۆ...

بێ دەنگ مەوەستە

بۆنی ئەو وەرزە لە هەناسەم ماوە

کە چنگێک زەردەخەنەی وەفامان

پێ بەخشی...





بڕۆ...

من بە چیا دەڵێم:

ئیدی ئێمە تەنها نین

ئێرە میراتی هەموومانە...

× × ×

بڕۆ...

بڕۆ...

بەڵام بەر لەوەی بڕۆیت

بیرت نەچێت..

بڕنەوەکەی باوکت هەڵگرە

ئێمە بەر لە چاوەڕوانی...

دەبێ تێپەڕین...

× × ×





بڕۆ...

بڕۆ...

بەڵام بزانە بۆ کوێ دەڕۆیت

کەس نییە دەستم بگرێت

ئەوە برینەکانم پیکەرە کۆڵتەوە

بڕۆ...

بڕۆ...

هەرگیز مەوەستە

با هاوارەکانم شی نەبنەوە!

# کەرنەڤاڵی عەشقی ناو بەفر!





تۆ گەنجینەی عەشقی بەفریت و

منیش..

هەموو ڕۆژێ بەر لەوەی خۆر هەڵبێ،

بەدووتا ئەگەڕێم

مرازەکانم لە خۆت بدەی!!

× × ×

دڵم ساوێلکەیە

دەنا چۆن ئەچووە گژ تاریکایی و

لە سپێدەیەکی دانەهاتووا،

داڵدەیەک بۆ (ئازادی) پێکەوە ئەنێ!!

× × ×



کەرنەڤاڵی عەشقی ناو بەفر .................... خالید مەجید فەتحوڵڵا

عەشق لای من

مانگێکی سەوزەو،

لە کەلی خەونەکانمدا،

بە لوتکە قەرسیلەکانی باڵاتەوە

هەڵئەزنێن!!

× × ×

ئێستاش،

چاوم لێیە...

ڕێگا لەناو تەرمی لاشەیەکی،

دەروون هەڵقرچاوا..

ئەپێچێتەوە داستانێک و

بۆ خەونێکی زەردەپەڕم ئەگەڕێ!!

× × ×





کێ دەمی ئارەزووی،

گشت عاشقێکی خۆش ناوێ...

ساباتی کام پیرۆکە،

شاعیر ناهەژێنێ...!!

× × ×

(ئەلوەن) کە تینوو ئەبێ

بۆ کوێ ئاڕوا..

تا تینوێتی خۆی بشکێنێ...!!

× × ×





بەرەبەیان،

پەنجەرەیەکی ڕوو تەنە!

ئینجانەکانی پشت سەری،

ڕەنگ ئادەنەوە...

چۆلەکەیەک،

ئاشێ بۆ پەنجەرەکەی من!

یا چۆلەکەکانیش،

بۆ دالدەیەکی فرە جوانتر

هەموو ماڵەکان ئەگەڕێن!!

× × ×

من..

لەوەتەی بوومەتە،

گۆرانی شیعر و..

دلخوازیی ئەبەخشێنمەوە

چەپک، چەپک

ئاوازەکان..

بەسەرپرچی،





هەموو کچێکا دائەهێنم!!

من تۆم هەر لەبیرە

گوڵە جوانەکەم

بەلآم،

چی بکەم..

لە بەفرا ونبوبێت و

تەنیا لە خەیاڵەکانما..

دێیت و،

لە سیلەمدا.. ڕائەکێشێیت!!

× ××





ئەو شەوە،

سەرم نایە،

سەر ڕانی هزرێک و

تۆم بینی،

ئاسکێک بووی..

بەسەر بەفرا،

غوربەتیت..

بۆ وەرزی زستانێکی زۆر سارد

ئەگوتەوە...!!

× × ×

چاوم،

هێشتا تەواو خەواڵو نەبوو بوو

پێکەوە بووین،

لە ژێر ساباتی عیشقێکی کۆیلەدا

شەماڵ،

پێئەکەنی و...

گوڵە نێرگزیش،



کەرنەڤالی عەشقی ناو بەفر ..................... خالید مەجید فەتحوڵڵا

لە چاومانا.. سەمای ئەکرد!!

تۆ،

ترسایت و

هاوارت کرد:

ڕاچڵەکە...!!

وا سەرما.. کڕێوەی هێنا

ئەک تۆیش،

بیاتەوە...!!

ڕاچڵەکە:

با ئەم –با– یە تووشە

تۆیش ئەگرێ!!

× × ×





ئێستا.

هەموو شەوێ

عەشق،

وەک کۆترێ

لە دڵما ئەگمێنێ!!

وەک منداڵێ،

حەز ئەکا.. پێ بگرێ!!

ئێستا،

سەردەمەکانی دەجالی عەشق

هاتوون:

پیاما هەلئەگڕێن!

نە پەنجەرەکان بەپێوەن:

دالدە پیەخشنە،

پاسارییەکانی دلم و...





نەیش،

بەهارەکان ئەترۆکێن:

بینەوە ژیانێکی سەوز!!

تۆیش..

هەر ونیت

منیش:

وام لەناو زامی شەو...و

تلاو تلی خەمە ئالۆسکاوەکان!!

ئەبێ مرازەکەم بێتە دی و،

ئەم شەوە نەشیاوە..

بە کێردێکی شیعرەکانم،

سەر بڕم و..





خۆر بێتە زمان!!

(ئەلوەن)یش..

بۆ تینوێتی،

ڕووبکاتەوە ئاسمان...!!

× × ×

# خەیاڵی کوژراو !!





خۆت خەونت دیتبوو

ئەو بەیانییە..

سامێک لە تەوقی سەرتەوە،

ڕاوی دەنایت و..

جێت بەخۆت نەدەگرت!

ئەو بەیانییە..

خۆر هەڵنەهات و.. تۆش،

چاوەڕوان بووی..

چۆلەکەیەک،

بەسەر مردنتدا... بفڕێ!

× × ×





هاوڕێم..

ئەی ئەوەی هاتیت و.. گوتت:

ئارام بە.. ئەی خۆشەویست

سەبووریی ئەم سەفەرە.. مەکووژە

لە من مەپرسە:

ئەم بەیانییە بۆ وەها پێپاکە.. بۆ؟

لەگەڵ بەهارێکدا هاتووم..

کە بۆنی چارەنووسی خۆی

بە فەنابوونێکی زووتر.. ڕەنگ دەکات!

× × ×





ئەمڕۆ..

چ ڕۆژێکە،

بەسەر سفرەوە.. دانەنیشتی.

تۆ بەدەم و دەنگی خۆت،

سەرسام بووی

لە مەرگیشدا،

لەژێر دەلاقەکانی هیچیدا..

سەیری دونیات دەکرد!

× × ×

من..

مانگم نییە،

لە زەردەخەنە.. تریک بیمەوە!

ناتوانم لە خەیاڵ بگەم

ئــەگینا فرمێــسکە قەتیــسماوەکانی ناوچــاوی

خۆمم..

بەر نەدەدا...

× × ×





بە هەر لایەکدا بچم..

ئەگەر عەشقی تۆ نەبێت

هەنگاوێکی دیکەمان لێدیار نابێت!

ئەوەی سەفەر نایدۆزێتەوە

ئێمە دەیبەینەوە ئەودیوی کەنار...

ئاخ!

سەیرکە..

عەشق.. چ گریانێکمان پێدەکات!

× × ×

من..

لە خەونەکاندا.. چاوساغی تۆم!

ئەگەر ڕێگا هەبایە..

تۆم هەر لەناو دڵی خۆمدا دەناشت!

× × ×





کە بەدوای سووتانی پەپوولەیەکدا دەگەڕێیت،

فەرامۆشی بکەیت..

بە پردێکدا.. دەپەڕیتەوە

بە تریک پەنجەرەیەکی تەنهایی خۆتدا،

تێدەپەڕێت!!

بەرامبەر بە هەتاو،

وەرە ناو بەهارێکی تەنیا

بەسەر کپی گوڵەنێرگزێکدا شۆڕبەرەوە..

لەوێدا..

سەرباژێکی ون،

دەتباتەوە بەردەم ماڵی عەشق!!

× × ×





بەڵام من

هەموو ماڵەکان گەڕام

مەرگ..

لەژێر سایەی درەختێکدا،

پاڵکەوتبوو...

.. کاغەزێکی سەوزی پڕ لە عەتری دەرهێنا

ئەگەر پێویستی کرد:

با بەقەد هەموو تەمەنی وریایی

لەسەر برینەکان..

خۆشەویستی.. بەری خۆی بچنێت و،

نوێژ..

بۆ هەموو جوانییەکان بکات

× × ×



کەرنەڤاڵی عەشقی ناو بەفر ..................... خالید مەجید فەتحوڵڵا

ئەی ئەوەی لە من ناپرسی،

لەم میحنەتەدا.. پێم بڵێ:

ئەم گریانەم..

بۆ لە گریانی پێشووتر ناچێت!؟

بۆ شوێن قەتماغەی برینەکانم،

ئاوتوێ ناکەیت؟

بۆ ناڕوانیتە گرێی نیگاکانم..

کە لەوپەڕی گریانەوە.. هاوار دەکات!؟

تۆ..

ئەی ئەوەی پێپاکی لە چارەنووسم!

ئەم ئێوارەیە..

هەموو ژیانم،

لە سێبەری چاوەڕوانییەکدا..

بروسکەی عیشقێک.. سووتاندوێتی





هەر تەنها خۆی دەزانێت..

دوای ئاوابوونی خۆر،

چەند ئەستەمە..

سەر بە خەیاڵی کوژراو بدەیت!

× × ×

**کەرکووک**

**٢٠٠٨/٢/١٣**

## گرەو.. لە سەر پاداشت و سزا ناکەم!





بۆ کوێ بچم..

گرەو لە سەر پاداشت و سزا ناکەم

من نامەوێ وەک پاڵەوانێک..

لە وێرانەکاندا تەپوتۆز بم

لە کتێبەکانیشدا –باران–

× × ×

بۆ کوێ بچم..

گرەو لە سەر پاداشت و سزا ناکەم!

من نامەوێ لەسەر خەیاڵ

ئاسمانی دڵم ڕاگرم

من نەهاتووم فێری -شێوەنتان- بکەم

× × ×



کەرنەڤالی عەشقی ناو بەفر .................... خالید مەجید فەتحوڵڵا

بۆ کوێ بچم..

گرەو لە سەر پاداشت و سزا ناکەم

چییەکەم بێ بەشم لە جەستەی خۆم

پێیەشم لە باوباران و ئەوین

پاییز بۆتە دۆستی من!

× × ×

بۆ کوێ بچم

گرەو لە سەر پاداشت و سزا ناکەم

من نامەوێ وەک دیاری

تەلیسمێک پەلم بگرێت

من نامەوێ بە خوێنی گوناه

یەکتر هەڵگرین!

من نەهاتووم ڕقم لە لێبوردن بێت

× × ×





بۆ کوێ بچم

گرەو لە سەر پاداشت و سزا ناکەم

ئەو نامانەم بۆ بخوێنەوە

لاوێتیم ئاشت بکەنەوە

ئێستا ڕازیم بە تەنهایی

بیر لەو بروسکانە ناکەمەوە

کە لە مەترسی جێژوان تێدەگەن و

ناشپرسن!

× × ×

بۆ کوێ بچم..

گرەو لە سەر پاداشت و سزا ناکەم!

من ڕێگەیەکم دەوێت..

بمباتەوە سەر قەدی درەختەکان

لەوێوە

هەموو ڕۆژێ بتوانم.. لە شوێن ئازار

دەست بەسینگمەوە بگرم

**کەرکووک ٢٠١٢**





## کەرکووک...

ئاسۆی گەشی ئایندەم لە کۆشی تۆدا دەبینم

تا ماوم، حەزدەکەم، لەگەڵ تۆدا، بژیم

لای تۆ، ماڵی سەرفرازی و دڵنیاییمە..

بێ وادە، لەنجەولاری تیا دەکەم

لای تۆ، جێناهێڵم من لەناو بێدەنگییەکاندا

لەناو هەموو ئەو نیازانەی کە نەهاتنە دی

لە نێوان ئەو هەناسانەی کە سەخت و خوێناوی

بوون





بیرت دێت... منداڵێک بووم، لەپاڵ دیوارو

لە بن درەختەکاندا.. بەختەوەریم بۆ ڕاو دەکردی؟

ئەوەی ئێستا لەمندا پێشبڕکێ دەکات..

خەونێکی گەورەیە، لە چاوەکانی تۆدا دەپشکوێت

منداڵێک بووم بۆ ئارەزوویکی چاوەڕوانکراو

پەلم دەکوتا وەک شێت بۆ ئەو ڕۆژانەی

کە دەمویست، ئاسۆی گەش، بەر لە شەفەق

هەڵبێت

کە هەرزەکار بووم وەک جەنگاوەرێکی وریا

چاوەڕوان بووم.. بەقەد ئاوێکی سازگار

فێنکی بەژیان ببەخشم، ئێستا گەورەم و

دەمەوێ لە شەونمی بەیانییەکدا بتوێمەوە

بزەی هەناسەیەکی گەرم و گوڕ

بۆ سییەکانم بەرێ

ئێستا گەورەم و لەنێوان دوو درەختدا

وەستاوم..





ببرم لای تاقە ڕێیەکە

بمباتەوە بەردەم ماڵەکەی خۆمان

هاتم وەک بروسکەیەکی تووڕە

شەوم دیلکرد!

تا ڕۆژ لە دڵمەوە نەچێت بەودیوا

کێ ڕێگەی ئازادیم پێ نیشان دەدات!؟

کێ دەمباتەوە بۆ تەپپەو

پیاسەیەکی ڕەحیماوە و ئیمام قاسم و

زێویە و بەرقەڵآم پێدەکات؟

کێ دەمباتەوە چیمەن و سەرخاسە..

کالیارێکی شیرینم بۆ بکڕێت؟

ئێوە –عەلی حەمام– چیتان پیستووە؟

شایی نەبوو..

سەرچۆپی نەگرێت..

چایخانەکەی –ئەحمەد کەریم– تان دێتەوە یاد؟

ڕۆژ نەبوو..





چڵکاوخۆرێکی بەعس، دارکاری نەکات.

ئێوە پردەکەی –فەزیلە– تان دێتەوە بەرچاو

وەک شۆخێکی دڵتەڕ،

خەونی بە ئاگرەوە دەبینی...!؟

× × ×

ئێوە..

منداڵیی بەیانیەکانی خۆتان نەژمارد.

(ڕۆژبەیانی) شەوێک هاتە لام..

-با-کان بەسەر ئێشەکانی من

دەگریان!

بەیانییەک (ئەسیری)م دیت

پێی وتم: من ئێرە جێناهێڵم!

تا بەدیار خاک و خۆڵی وجودی خۆمەوە





پیر دەبم.. تۆ هەستە، چاوەڕوانیەکانی

خۆت، نیشان بدەو.. پێ لە جوانیەکان

مەنێ. من. چاوم لە کەلێنەکانی ئەم

ئاگردانە دەبێت، تا پشکۆی نهێنیەکی

گەورە، دێتە ژووری، بۆ ناو دڵ!

چیتر بێدەنگ نابم.

من یەک پەنجەرەم هەیە

دەتوانم سەیری ئاسمان بکەم

من کە هاوار دەکەم

حەز دەکەم بڕۆن چڵی ئەو درەختانە

ماچ بکەن.. کە تەنهایی خۆیان دەژمێرن

ئێرە جێناهێڵم

تا وەک پێشمەرگەیەکی ئێسک سووک

بەدەم سیحری خەوێکەوە

بۆنێکی ئەوتۆ دەچێت بەدڵما

لەسەر خوانە ڕازاوەکەی کەرکووک

× × ×

**کەرکووک ٢٠١٢**





## مەڵێ بۆ!

زۆر لەمێژە بۆت وەستاوم
دڵم شەیدای کوڵمی نەرمە
واتێمەگە من هەڵە بم
جوانە لەتۆ ئەو پەرچەمە

× × ×

بەخەیاڵ لێوی تۆم هێنا
دوێنێ شەو بۆ سەر لێوی خۆم
چمکی سەرینم تێر گوشی
تامت گەیشتە پەلوپۆم

× × ×





بەیانی کە لە خەو هەستام
بەتاقی تەنیا زۆر گریام
ئەو فرمێسکانەی کە رژان
سۆزی عەشقت بوون لە نیگام

× × ×

دڵی من هێشتا خونچەیە
بە ماچی لێوت دەپشکوێت
تا نزیک بی هێشتا دووری
کەی خۆشەویستی وا دەبێت

× × ×

چیتر بڕۆم یان بێمە لات

ئاخم لە عەشقت جمەی دێت

بۆ کوێ بچم لە هەر کوێ بم

درۆیە من تۆم لەبیر بچێت

× × ×

کە هاتییە لام بێ ترس وەرە

دوودڵ مەبە کچی شەرمن

لە هەمان شوێن چاوەڕێتم

چوار دەورم پڕبێ لە دوژمن

× × ×





وەرە ژێر دڵم، مەڵێ بۆ

شەرابی عەشقی تۆم دەوێ

مەستمکە لە باخی سینەت

گەرتۆ خەوی خۆشت دەوێ

× × ×

**کەرکووک ٢٠١٣**

# کێ تەنیاییم ئەدۆزێتەوە!؟





لە چاوەکانتا ئەو سۆزە ئەبینم
هەستەکەم بوومەتە دێوانە
گوێم لە چریوەی کانییە و
سەر ئەدەم لە زریوەی خۆر و. لەوێم
ئەو وەختەی حەز بە ماچی لێوت ئەکەم
سەر ئەدەم لە ترکەی ئاخت

چمکی ئەو ژانەم بۆ ناگیرێ
کە لە دڵما ڕەنگ ئەداتەوە
چەند جوانە لەتۆ.. ماچی گوڵ و
ئاگری ژوان و نەغمەی پێکەنین
چەند خۆشە لەتۆ... خەونی پەمەیی و
خۆزگەی سپی.. کە تێکەڵ بەمن ئەبی

× × ×





لە چاوەکانتا ئەو عەشقە ئەبینم
هەستەکەم..
دڵم بووەتە گڕی ئەو ئارەزووەی
دانامرکێ...
دەنا بۆچی مەینەتی دڵ و دەروونم بەرنادا
خۆ من میوان نەبووم.

یادگاری خۆم بۆ کردیتە شۆڕەبی و

بۆ باڵات گریام لەتەکما ئارام بگری

بۆ کەس هێندە نەگریاوم

هێندەی خرۆشاوم بەخۆشەویستی تۆ

بۆ کەس هێندە بەپەرۆش نەبووم

هێندەی ئەو ژامەی تامەزرۆیە

بۆ هەناسەت





من ویستم بسکی تریفەی مانگەشەوت

بۆ بکەم بە گوڵە شیعر و

زەبری ئەندێشەم بە نووری چاوەکانت

هەڵبواسم

× × ×

تووڕە نیم لەتۆ

کێ تەنیایی من ئەدۆزێتەوە!؟

کێ ژانی ئێرە و ئەوێم دەکاتە کۆڵ!؟

کێ ناونیشانی خۆرم دەداتێ و

شیعر و بارانم بۆ دەکاتە دەرگە و

چاوەڕێی هاتنم دەکات؟

کێ گریانی تەمەنم دەژەنێ و





شوێن هەنگاوی عەشقم دەپێوێت!؟

کێ دەزانێ من چەند خۆشم دەوێیت!؟

با بێت بۆ دیدەنیم...

بستە خاکێک نەماوە لە دڵما هەڵنەقرچێ و

لەگەڵ وردە فرمێسکم خوناوی شیعر لێڵ نەکات

کێ وەک من بەگەرمی وەستاوە بۆ ژوان!؟

کێ وەک من پەنجەرەکانی دڵی

کراوەن بۆ تۆ.. بۆ خۆشەویستی!؟

کێ وەک من جەرگی بریندارە بۆ دیدەت!؟

کێ وەک من ژانی عومرت هەڵدەگرێ وا!؟

هەموو بەیانییەک

لە چاوەڕوانی ڕێگەتا وەستاوم. بتبینم.

من چاوەڕێی کۆچی تۆ نەبووم





من و تۆ بۆ یەک لەدایک بووین

تۆ گڕ لەمن بەردەیت و

میوانی هەمیشەم بیت

منیش وەک دێوانە

شەو بەدیار لێوەکانتەوە

ماچت بۆ بکەم بە هۆنراوە

× × ×

کەرکووک ٢٠١٣

# شیعر و شەپۆل





تۆیان بە دیرۆکی هەزاران ساڵەوە ڕاکێشاو
شنەی عومریان سپاردیتە بیابانێکی چۆڵ.
خۆزگە نەمابوو لە هزری پەپوولەیەکدا
وەک وشەیەکی ژیکەڵە
بەدار بەڕوویەکی تینوودا بهەژێت

× × ×

تۆیان تێکەڵ بە خوێن و بەفر کردو

ڕقیان بە هەناسەی تۆ سارد کردەوە

گوێیان لێ نەگرتیت.

چیایان لە تۆ دابڕی و

کانی و سەرچاوەیان لەخاچدا

وەک لاشەیەکی سەربڕاو





مایتەوە و

نیگا لە گلێنەتا

پڕ بوو لە لەرز و تا.

خەونێک نەبوو بۆ خۆتی هەڵبژێری و

پرووسکی جەستەت بدۆزیتەوە

حەسرەتێک شەوانە ڕایدەپێچایت

وەک کەنارێکی باڵا

عەشقت بۆ باڵای عەشق دووری

بۆ ئەو ڕۆژانەی دەپرسن

شیعر و شەپۆل

چۆن بە تاوی هەستی تۆ پێ دەگرن!

**کەرکووک ٢٠١٣**





## شاعیر لە چەند دێڕێکدا:

**- ١٩٦٠ لە کەرکووک لەدایك بووە.**

**- ١٩٨٣ دەرچووی کۆلێژی ئاداب/ زانکۆی بەغدا.**

**- ١٩٩١ ژنی هێناوەو باوکی (ئایڤەر و نەورۆزە).**

**- ٢٠٠٤ بە مامۆستا دامەزراوە و حاڵی حازر لە پەیمانگەی مامۆستایانە لە کەرکووك.**

**- تا ئێستا ئەم بەرهەمانەی بەچاپ گەیاندووە:**

**- خونچەکان –نامیلکە شیعر- ١٩٧٨.**

**- کشانەوەی مەرگ – شیعر- ٢٠٠٠.**

**- پرسیارە نەزۆکەکان –کۆمەڵە چیرۆك- هاوبەش- ٢٠٠٠.**

**- گورگ –چیرۆکی وەرگێڕدراو- هاوبەش- ٢٠٠٥.**

**- شوێنەواری خوێنەکەت لەسەر بەفرەکەدایە- چیرۆکی وەرگێڕدراو –هاوبەش- ٢٠٠٦.**

**- دراسات في جغرافيه السكان- دراسات اكاديميه- ٢٠٠٧.**

**- دەرگاکان- کۆچیرۆك-٢٠١١.**

## ئەو کتێب و بڵاوکراوانەی لقی کەرکووکی یەکێتی نووسەرانی کورد پاش کۆنفرانسی ئازادی بەچاپی گەیاندوون جگە لە گۆڤاری گزنگ کە بەردەوام مانگانە دەردەچێت

| ز | ناوی کتێب | بابەت | نووسەر | وەرگێڕ | ساڵ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٠٨ | خوێندنەوەی چەند دەقێکی ئەدەبی و فیکری | خوێندنەوە | سامان محەمەد | | ٢٠١٠ |
| ١٠٩ | هەرمێیەکانی فیرعەون | شیعر | ئەحمەدی مەلا | | ٢٠١٠ |
| ١١٠ | تەونێك لە شیعر و وشە | لێکۆڵینەوەی ئەدەبی | مەحمود نەجمەدین | | ٢٠١١ |
| ١١١ | ١ ١ ١ نامەی سۆزداری | تێکستی دڵداری | کۆکردنەوە و ئامادەکردنی: حەمە سەعید زەنگنە | | ٢٠١١ |
| ١١٢ | دانای کوێخا شەوکەت | ڕۆمان | موعتەسەم ساڵەیی | | ٢٠١١ |
| ١١٣ | سەمای روح | کورتە چیرۆك | نەوزاد یوسف کاکەیی | | ٢٠١١ |
| ١١٤ | سلێکوك هۆکلێر عاجباتیی هەشتەم | ڕۆمان | عەبدوڵڵا سەڕاج | | ٢٠١١ |
| ١١٥ | خەزان و شنەی بەیان | شیعر | غازی ڕەشید زەنگنە | | ٢٠١١ |
| ١١٦ | بزووتنەوەی ڕوانگە و شاعیرانی حەفتا و | لێکۆڵینەوەی ئەدەبی | د.هیمدادی حوسێن | | ٢٠١١ |
| ١١٧ | ئاوابوونی جەستە لە سەفەری دڵدا | شیعر | ستار ئەحمەد عەبدولڕەحمان | | ٢٠١١ |
| ١١٨ | دەرگاکان | کۆچیرۆك | خالید مەجید فەتحوڵڵا | | ٢٠١١ |
| ١١٩ | تەنیا لەبەر مەعاشەکەیە | کورتیلە چیرۆك | بەکر دەروێش | | ٢٠١١ |
| ١٢٠ | گەشەکردنی زمانی منداڵ | زمانی منداڵ | | و: د.ئازاد باخەوان و ناصح محمد | |
| ١٢١ | لە لووتکەی ئەدەبی ئەڵمانەوە | لێکۆڵینەوەی ئەدەبی | عومەر عەلی شەریف | | ٢٠١١ |
| ١٢٢ | وازییەکانی ڕەشەگۆم | ڕۆمان | کاکە مەم بۆتانی | | ٢٠١١ |
| ١٢٣ | شاری لە غەم ئاوسبوو | ڕۆمان | سالار ئیسماعیل سەمین | | ٢٠١١ |





| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٢٤ | ململانێ لەگەڵ پرسیاردا | کۆدیدار | دانا عەسکەر | | ٢٠١١ |
| ١٢٥ | ئەو نامانەی بۆ پیرێتی خۆم دەیاننێرم | دەق | سوارە نەجمەدین | | ٢٠١١ |
| ١٢٦ | عامُ الصِّفو | شعر | صباح رەنجدەر | ترجمە: المهندس محمد حسین رسول | ٢٠١١ |
| ١٢٧ | ڕاکشان لە تەنیشت تارمایی نیشتمانەوە | چەند دەقێکی شانۆیی | عەبدوڵا سلێمان (مەشخەڵ) | | ٢٠١١ |
| ١٢٨ | لقاءات تحت أشعة الحروف المشرقة | مجموعة حوارات | سردار زنكنه | | ٢٠١١ |
| ١٢٩ | دزەکان | کۆمەڵە چیرۆك | | ئازاد نەجم | ٢٠١١ |
| ١٣٠ | ڕووبەرێکی ڕەخنەیی | ڕەخنەی ئەدەبی | د. فوئاد ڕەشید | | ٢٠١١ |
| ١٣١ | کتێب | خوێندنەوەی بیست تێکستی | جەلیل کاکەوەیس | | ٢٠١١ |
| ١٣٢ | لە سۆاخی عیشقدا | کۆمەڵە چیرۆك | سەلمان شێخ بزێنی | | ٢٠١١ |
| ١٣٣ | عومەر سەیفەدین | لێکۆڵینەوە | | و. لە تورکییەوە: ئەحمەد تاقانە | ٢٠١١ |
| ١٣٤ | مەحوی ناسی | لێکۆڵینەوە | هیمداد شاهین | | ٢٠١١ |
| ١٣٥ | بەیداخ | نۆڤلێت | حەمە کەریم عارف | | ٢٠١١ |
| ١٣٦ | زایەڵەی ئاوەسپی | کۆمەڵە بەرهەم | ئا: بەکر دەروێش | | ٢٠١١ |
| ١٣٧ | بازاڕی ناوخۆیی | ڕۆمان | | و: بورهان ئەحمەد | ٢٠١١ |
| ١٣٨ | ڤلادیمێر سیمۆنەڤیچ ڤیسۆتسکی | وەرگێڕان | | و: لە رووسییەوە: | ٢٠١١ |
| ١٣٩ | پەنجەرە بچووکەکان | وتاری [illegible] | ئازاد عەبدولواحید | | ٢٠١١ |
| ١٤٠ | چەند بوارێکی زانستی زمانەوانی کوردی | زمانەوانی | حمید خالید کەریم | | ٢٠١١ |
| ١٤١ | گەڕانەوە | چیرۆك | چنوور نامیق | | ٢٠١١ |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٤٢ | لە مەدرەسەی نالییدا | لێکۆڵینەوەی ئەدەبی | حەمە مەنتك | | ٢٠١١ |
| ١٤٣ | قاوەخانە | کۆمەڵە چیرۆك | | و: ستار شێخانی | ٢٠١١ |
| ١٤٤ | دارستانێك لە شمشاڵ | شیعر | نامق هەورامی | | ٢٠١١ |
| ١٤٥ | شینبوونی بەرد | کۆچیرۆك | د. موحسین ئەحمەد | | ٢٠١١ |
| ١٤٦ | چۆن و چی بۆ منداڵ | لێکۆڵینەوە | لەتیف هەڵمەت | | ٢٠١١ |
| ١٤٧ | مصطبة وحيدة أمام القلعة | دراسة | فاروق مصطفي | | ٢٠١١ |
| ١٤٨ | في الشعر الكُردي المعاصر | دراسة | هشام القيسي | | ٢٠١١ |
| ١٤٩ | کتێبی بۆشاییەکان | شیعر | ئەدیب نادر | | ٢٠١١ |
| ١٥٠ | ئەو هەتیوەی نابێت بە پیاو | چیرۆك | | عەبدولستار جەباری | ٢٠١١ |
| ١٥١ | ڕاز و گەمەی ئیشق | شیعر | عەباس مەجیـــد | | ٢٠١١ |
| ١٥٢ | نووسەر و نووسینەوەی زمان | لێکۆڵینەوە | نیهاد جامی | | ٢٠١١ |
| ١٥٣ | زیارەتی ماچ | شیعر | ڕەسووڵ سوڵتانی | | ٢٠١١ |
| ١٥٤ | لە گێژەنی پرسیاردا | دیمانە | حەمەفەریق حەسەن | | ٢٠١١ |
| ١٥٥ | بنەماکانی ڕەخنەی ئەدەبی | ڕەخنەی ئەدەبی | محەمەد سابیر مەحموود | | ٢٠١١ |
| ١٥٦ | دڵی داگیرساوی دانکۆ | چیرۆکی وەرگێڕردراو | | و: ئەحمەد عارف | ٢٠١١ |
| ١٥٧ | شورای گۆڕەکان | کورتە چیرۆك | هیدایەت محەمەد | | ٢٠١٢ |
| ١٥٨ | کۆچباری گزنگ | ڕۆمانە شیعر | ستار ئەحمەد | | ٢٠١٢ |
| ١٥٩ | بالوولی داناو قەرەقووش | بەسەرهات و پەند و ئامۆژگاری | عەبدوڵلا عەبدولڕەحمان زەنگنە | | ٢٠١٢ |





| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٦٠ | هونەرستان | خوێندنەوەگەلێکی هونەرییە | ئازاد گەرمیانی | | ٢٠١٢ |
| ١٦١ | بەسەر شانی سەحەردا وەرە | کۆمەڵە شیعر | عەبدولرەحیم سەرەڕۆ | | ٢٠١٢ |
| ١٦٢ | مینا ڕەنگینەکان | کورتە چیرۆك | جەلیل محەمەد شەریف | | ٢٠١٢ |
| ١٦٣ | چیرۆکەکان | کۆمەڵە چیرۆك | محەمەد عەبدولڕەحمان زەنگنە | | ٢٠١٢ |
| ١٦٤ | گەڕانەوەی تارماییەکەی ژەنەراڵ | کۆچیرۆك | سەمەد ئەحمەد | | ٢٠١٢ |
| ١٦٥ | کەرکوك لە دیدی چەند سەرچاوەیەکدا | لێکۆڵینەوەی مێژوویی | هاشم عاصی کاکەیی | | ٢٠١٢ |
| ١٦٦ | گوڵبژێرێك لە وتەی ناوداران | وتەی ناوداران | ئامادەکردنی: ڕەزا شوان | | ٢٠١٢ |
| ١٦٧ | ئەزموونی ڕۆژنامەگەریم | یادەوەری | زاهیر ڕۆژبەیانی | | ٢٠١٢ |
| ١٦٨ | مەرگی ئیلزە باسکولایت | کۆمەڵە چیرۆکی وەرگێڕدراو | و. حسێن عەلی | | ٢٠١٢ |
| ١٦٩ | هۆنراوەکانی تیلەکۆ | هۆنراوە | عاسی عەلی تیلەکۆ | | ٢٠١٢ |
| ١٧٠ | بۆ زاخاوی مێشك | مەتەڵ بۆ منالاّن | عوسمان دەروێش شکور | | ٢٠١٢ |
| ١٧١ | نیوەی پڕی من نیوەی بەتاڵی ئاوێنە | شیعر | گوڵباخ بەهرامی | | ٢٠١٢ |
| ١٧٢ | تۆبەی فیرعەونی | شانۆنامە | وریا شەهاب | | ٢٠١٢ |
| ١٧٣ | هەنگاوێك بۆ ساغکردنەوەی دیوانی | لێکۆڵینەوە | ئا:کاروان عوسمان عەلی | | ٢٠١٢ |
| ١٧٤ | مۆزایکی خۆشەویستی و مردن | چیرۆکی وەرگێڕدراو | | و: عەبدوڵلا مەحمود زەنگنە | ٢٠١٢ |
| ١٧٥ | آراء وملاحظات نقدية عن الثقافة الكوردية | آراء | جمعة الجباري | | ٢٠١٢ |
| ١٧٦ | بڵقی بەرد | کۆشیعر | خالید کاوێس قادر | | ٢٠١٢ |
| ١٧٧ | کۆچی باڵندەکان | کۆمەڵە شیعر | سالّەح هەلاج | | ٢٠١٢ |
| ١٧٨ | گورگ و مرۆڤ | چیرۆك بۆ منالاّن | گرفتار کاکەیی | | ٢٠١٢ |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٧٩ | خۆشترین چیرۆکی ئەویندارن | چیرۆکی وەرگێڕدراو | دەرویش ئەلجەمیل | و. وەلید رەمەزان کەریم | ٢٠١٢ |
| ١٨٠ | پیاسەیەك لەگەڵ نوحدا | شیعر | بورهان ئەحمەد | | ٢٠١٢ |
| ١٨١ | ڕەهەندەکانی کوردستانیبوونی قەزای | لێکۆڵینەوە | حەسەن بارام | | ٢٠١٢ |
| ١٨٢ | شەقامەکانی دڵ | شیعر | سەلاح قابیل | | ٢٠١٢ |
| ١٨٣ | دوو شانۆگەری و چەند باسێکی شانۆیی | شانۆنامە | سوارە کافرۆشی | | ٢٠١٢ |
| ١٨٤ | هاواری ئەنفال | شیعر | محمەد ئەمین ڕەشید | | ٢٠١٢ |
| ١٨٥ | لە چاوەڕوانی هیچدا | شیعر | سەیوان سەعیدیان | | ٢٠١٢ |
| ١٨٦ | بە باوەشێك لە فەناوە نیشتمانی زویر.... | شیعر | عەبدولا سلێمان (مەشخەڵ) | | ٢٠١٢ |
| ١٨٧ | المدينة الحُبلى بالـهم | رواية | سالار إسماعيل سمين | أنور حسن موسى | ٢٠١٢ |
| ١٨٨ | ئەو هەورانەی نەبوون بە ماچ | شیعر | چنوور نامیق | | ٢٠١٢ |
| ١٨٩ | پینیکیو | رۆمان بۆ مێردمندالآن | سەرتیپ محەمەد هەمەوەندی | | ٢٠١٢ |
| ١٩٠ | شیرین تر لە دەق | لێکۆڵینەوە و ڕەخنە | سەردار جاف | | ٢٠١٢ |
| ١٩١ | رەخنە و هەندێ لە راستییەکان | رەخنە و لێکۆڵینەوە | غەفور ساڵح عەبدولا | | ٢٠١٢ |
| ١٩٢ | من و دەریا | شیعر | عەباس جەمیل جێماو | | ٢٠١٢ |
| ١٩٣ | باخچەی گوڵ و پەپوولە | هۆنراوەی منداڵان | ئەسعەد لوڕ زادە | | ٢٠١٢ |
| ١٩٤ | فیغانێك لە کەرکوکەوە | کۆمەڵە شیعر | نەوزاد محەمەد کاکەیی | | ٢٠١٢ |
| ١٩٥ | ژنێك لێوانلێو لە ئەوین | کۆمەڵە شیعر | خالید باشبلاخی | | ٢٠١٢ |
| ١٩٦ | هاوارەکانی ڕۆژانی جەنگ | ڕۆمان | موعتەسەم ساڵەیی | | ٢٠١٢ |
| ١٩٧ | لە ڕۆخی ڕووباری وێژەوە | لێکۆڵینەوەی ئەدەبی | سەنگەر قوباد | | ٢٠١٢ |





| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ١٩٨ | کتێبێکی سەیر لەبارەی شیعرەکانی شێخ ڕەزای | ڕەخنەی ئەدەبی | حەمەساڵح فەرهادی | | ٢٠١٢ |
| ١٩٩ | گوڵخانەی عاریفان | لێکۆڵینەوە | هیمداد شاهین | | ٢٠١٢ |
| ٢٠٠ | حزب گوڵەباخ الجماهيري | مجموعة قصص | محمد سعيد زەنگنە | ترجمە: عوف عبدالرحمن عبدالله | ٢٠١٢ |
| ٢٠١ | برء الآلام | طب أعشاب | الشيخ (محيي الدين)الكركوكي | إعداد: عبدالجبار شوجة البرزنجي | ٢٠١٢ |
| ٢٠٢ | زایەڵەی ئاوەسپی | کۆمەڵە وتارێکی ئەدەبی و رۆشنبیریی | کۆکردنەوەو ئامادەکردنی : بەکر دەروێش | | ٢٠١٢ |
| ٢٠٣ | ئاڤێستا و یەکتاپەرستی | لێکۆڵینەوە | عومەر حاجی عەلی زەنگەنە | | ٢٠١٢ |
| ٢٠٤ | پاڵەوان لە حیکایەتی فۆلکلۆری کوردی (ناوچەی | لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەیی شیکارییە | سازان جوهر حمه غريب | | ٢٠١٢ |
| ٢٠٥ | أنوثة مدينة | قصائد | يوسف شواني | | ٢٠١٣ |
| ٢٠٦ | مێخەك | ئەزموونی رۆژنامەگەریی | ستران عەبدوڵڵا | | ٢٠١٣ |
| ٢٠٧ | نامەی بەر لە خۆر ئاوابوون | چیرۆك | فەیسەڵ هەمەوەندی | | ٢٠١٣ |
| ٢٠٨ | گەڵای وشە | خوێندنەوە | لەتیف فاتیح فەرەج | | ٢٠١٣ |
| ٢٠٩ | هەنسك | پەخشان | ئەرشەد تەحسین | | ٢٠١٣ |
| ٢١٠ | ئەڵقە | هۆنراوە | شوان مجید (سەدایی) | | ٢٠١٣ |
| ٢١١ | خوێنی ڕژاوی دوو سێو | قەسیدە | دانا عەسکەر | | ٢٠١٣ |
| ٢١٢ | بزورگی عەلەوی (جانتا) | کۆچیرۆك | بزورگی عەلەوی | و. حەمە کەریم عارف | ٢٠١٣ |
| ٢١٣ | فڕین تەعارف قەفەسێکە | کۆمەڵە شیعر | یونس حسەینی | | ٢٠١٣ |
| ٢١٤ | الربيع الأسود | رواية | أحمد محمد إسماعيل | مكرم رشيد الطالباني | ٢٠١٣ |
| ٢١٥ | هەڵوەرینی دەمامکەکان | کورتیلە چیرۆك | هیوا حوسێن ئەمین | | ٢٠١٣ |
| ٢١٦ | لە هۆڵە تاریکەکانی شانۆ | کۆمەڵە وتار | کۆسرەت عەبدولڕەحمان | | ٢٠١٣ |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ٢١٧ | ئاوێنە و دەمامك | کۆچیرۆك | | عەبدوڵڵا مەحمود زەنگنە | ٢٠١٣ |
| ٢١٨ | بەها پەروەردەییەکان لە رۆژنامەگەری منداڵدا | توێژینەوە | فازڵ رەشید ساڵح | | ٢٠١٣ |
| ٢١٩ | پەندی پێشینان رێ نیشاندەری ژیان | پەندی پێشینان | ئا: عوبێد شێخ لەتیف بەرزنجی | | ٢٠١٣ |
| ٢٢٠ | پەندی ئینگلیزی و کوردی | لێکۆڵینەوە و بەراوردکاری | | و. ئامادەکردنی: دکتۆر ئازاد | ٢٠١٣ |
| ٢٢١ | گوڵی هەتاو | شیعر | عوبێد ئەحمەد | | ٢٠١٣ |
| ٢٢٢ | دیوانی مەلا نەجمەدین بێبەش | دیوانە شیعر | ئا: هەردەوێڵ کاکەیی | | ٢٠١٣ |
| ٢٢٣ | ڕەخنەی کۆمەڵایەتی لە هۆنراوەکانی حاجی | لێکۆڵینەوە | ئا: گۆران عەبدولجەبار ئەحمەد | | ٢٠١٣ |
| ٢٢٤ | بەبێ تۆ ئاسمان نابینم | شیعر | حەمە کاکە ڕەش | | ٢٠١٣ |
| ٢٢٥ | کەرنەڤاڵی عەشقی ناو بەفر | پەخشانە شیعر | خالید مەجید فەتحوڵڵا | | ٢٠١٣ |